





# ( پیشەکی )

هونەر بەدریژایی ژیانی مروڤ هەرلەژیانی سەرەتایی نێو ئەشکەوتەکان بگرە تاکو ژیانی ئێستای هەمیشە پێویستیەکی گرنگی ژیانی بووە .هەمیشە وەك هاورییەکی سەیری کردووە و بەکاری هیناوە .بێگومان هونەر لە رووی بەکارهینانی لەلایەن مروڤەوە لەخووە نەبووە بەلکو گرنگی و فراوانی جورو بەشەکانی هونەر بووە و وای لە مرۆڤ کردوە پەنای بو بەرێت و بەکاری بهینییت.دەتوانین بلیین هونەر هەر بەش و جوریکی وەربگرین مروڤ پیش لە هەرشتی بیزانیت ئەو بەشەی وەر گرتووەو لەژیانی روژنەیدا بەکاری هیناوە . وەك سەرەتای هونەری وینەکیشانی aبەکارهیناوە بەجوریك مروڤ پیش لەهەرشتی بیزانیت زمانی وینەی بەکارهیناوە واتە مروڤ وینەکیشیك بووە نمونەی ئەمەش دوزینەوەی زوریك aلەو پاشماوە هونەریانەیەکەلەئەشکەوتەکاتی( ئەلتامیراو کاستیلوو کاندیمالەئیسپانیاوئەشکەوتەکانی( لاسکو و ئابوبیشومیریل ونیبواییو لە فەرەنسا )هەروەها ئەشکەوتەکانی ( هەزار میردو زەرزی و...هتد لەکوردستان )کە دەگەریتەوەبو هەزاران سال پیش ئیستا .وە هەروەها هەرچی هونەری شانوگەری و نواندنیشە دیسانەوە مروڤ پیش لە هەرشتی وانە نوسین و خویندنەوە بزانیت ئەکتەریکی شانویی بووە و لە ریگەی ئاماژەوە یەکتریان تیگەیاندووە واتە دیسانەوە هونەر بوتە هوکاری ژیانی مروڤ. هەرچی هونەری موسیقاو گورانیشە مروڤەکان لەکاتی کارکردن و ریو رەسمە ئاینی یەکاندا هەمیشە هونەری دەنگی بەکارهیناوە هونەر لای مروڤ پیویستی روژانەی بووە .هونەر هەمیشە بەشداری کردووە لە ژیانی مروڤەکاندا ئەوە هونەرە لە ژیانی سەرەتایدا دەبیتە هوکاریکی گرنگ بوریکخستنی ژیانی مروڤەکان بێگومان بەکارهینان و پەنابردنی مرۆڤەکان بو هونەر هەمیشە بە دووئاراستەی تەرییدا بووە وەك:

ئاراستەی یەکەمیان /هونەر وەك پیویستی ژیانی مرۆڤ بەکارهاتووە واتە پیویستی یەکانی ژیانی روژانەی بە هونەر پرکردۆتەوە یاخود پیویستی یەکانی ژیانی روژانەی بەهونەر دروست کردووە.

ئاراستەی دووەم/بو مەبەستی جوانکاری چێژی روحی واتە هونەر وەك هونەر .ئیتر ئەم دوو ئاراستەیە شانبەشانی ژیانی مرۆڤەکان هاتوون تابەژیانی ئەمروشمان دەگات هەمیشە بەشداریان لە بوارو کایە جۆراو جورەکانی دا کردووە واتە بواریك یان کایەیەکی ژیانی مروڤ نیە هونەر بەشداری تێدانەکات بێگومان لە هەربوارێکی ژیانی مروڤیشدا هونەر بەکارنەیەت ئەوا ئەو بوارە یان کارە مردووە یان کاریکی وەستاوو بێ چێژە .هونەرەکان جیاوازن ئەویش بە پێێ جورو شێوازی دەربرینیان بەجورێك هەندێکیان سەربە هونەرە ماددیەکان یان ( ماتریالیەکانن وەك( هونەری شێوەکاری( وێنەکیشان- پەیکەرسازی-سیرامیك-گرافیك-دیزاین.کاری دەستی....هتد )وەهەرچی هونەرە نامادیەکان ( ناماتریالیەکان )وەك( هونەری نواندن –موسیقاو گورانی-سەما-هونراوە -چیروك –رۆمان...هتد )وەهەروەهادەتوانین لەسەربنچینەیەکی تر هونەرەکان دابەشبکەین بۆ ئەم جۆرانەی لای خوارەووە :-

یەکەم /هونەرە بینراوەکان/وەك هونەری شیوەکاری –هونەری نواندن –هونەری سینەما –هونەری وەرزشی

دووەم/هونەرە بیستراوەکان/ وەك هونەرەکانی موسیقاو دەنگ.

سی یەم /هونەرە بیستراوو بینراوەکان/وەك هونەرەکانی نواندن –سینەما –کلیپ.....هتد.

یان دابەشکردنیکی تر ( هونەرە نەجولاوەکان( ستاتیك ) هونەرە جولاوەکان( دایناميك ). بەگشتی هونەر هە رجۆرو بەشێکی بگرین دەبینین بەشداریەکی بێ,وێنەی کردووە و دەیکات لە ژیانی مروڤدا چ لە رووی ماددی چ لە رووی مەعنەوی یان چ لە رووی روخساری ژیانی مروڤەوە چ لە رووی ناوەروکی بیەوە بیت کەواتە هونەر چەندین پیناسە لە دەور خوی کودەکاتەوە لەوانە :-

*هونەر/بریتی یە لە دەربرینی ناخی هونەرمەندو بەرجەستەکردنی لە کاریکی هونەریدا.

*هونەر /گوزارشت کردنەلە ناخو هەستی هونەرمەندەکان.

*هونەر /بریتی یە لە ریکخستنی حەزو ئارەزووەکان ( ئەرستو )

*هونەر/بریتی یە لە زیاد کردنی شتی بو سەر شتیکی تر( ئەفلوتین )

*هونەر/گوزارشت کردنە لە هەستەکانی مروڤ( هیربرت رید )

قوناغەکانی گەشەی هونەر لای مروڤی سەرەتایی تاکو\ئیستا بریتی یە لە :-

یەکەم/قوناغی چاخە بەردینی کون/( بولیولیسك ) سالانی( ٧٠٠-٥٠٠پ.ز) ئەمیش چەند قوناغیکی لی جیا بوەتەوە لەوانە :-

ا-قوناغی سەرەتا ( شیلی ) ب-قوناغی ناوەراست( موستری )

ج-قوناغی کوتا( ئورنیاك )ئەمیش دەکریتە/( قوناغی سولوتری-مادلین

دووەم/قوناغی بەردینی ناوەراست( میزولیسك )( سالانی١٢-١٨پ.ز)

سی یەم /قوناغی بەردینی نوی/لەم قوناغەدا مروڤەکان گەشتنە ئەوەی کە سەرجەم پیداویستی یەکانیان لەکەرەستەی جوراو جوری دروست بکە بەدەر لە بەرد

چوارەم/قوناغی مسی و برونزی/ئەم قوناغەش بەدوزینەوەی کانزای مس و برونزوچەندانی تر کارەهونەریەکان ەلە قوناغی بەردەوە گورا بو کانزا.

پینجەم/قوناغی ئاسن/کارە هونەریەکان لە ئاسن دروست دەکران.

شەشەم /قوناغی نوی بیگومان ئەم قوناغی نوییە لە بەر پیشکەوتنی زیاتر ی زانست شیوازە هونەریەکانیش یان بلیین کارە هونەریەکان وبەرهەمە هونەریە کانیش فرەجورو فرە رەنگ بوون هەر بویە کاری هونەریش بەردەوام لە پیشکەوتن و گەشەی بەردەوام دایە وە ئیستا لە جورەها تەکنیك و کەرەستەی جیاواز کاری هونەری ئە نجام دەدریت.

کەواتە دەتوانین بلێین مروڤەکان هەمیشەو لەسەردەمە جیاوازەکاندا و هەرسەردەمەو بە پیی بوونی کەرەستەی تایبەت هونەری بەکارهیناوە لە دروستکردنیدا بو یە هەمیشە هونەر زمانی راستی مروڤەکانە و هەمیشە هوکاریکی گرنگیش بووە و دەبی لە خزمەتکردن بەژیانی مروڤایەتی و دەبیتە هوکاریکی گرنگ بو گەیاندن و رازاندنەوەی سەرجەم بوارە جوراو جورەکانی ژیانی مروڤ..



نمونەی وینەیەك لەسەردیواری ئەشکەوتی لاسکو



وینەی مروڤیکی کۆن لەکاتی کیشانی وینە سەردیواری ئەشکەوتیك

# هێلکاری هونەرەکان

- هونەرە جوانەکان
  - بینراووبیستراو
    - نواندن و دراما
    - شانۆگەری
    - فیلمی )tv(
    - میلمی سینەمایی
    - تصمیم-دیزاین
  - بیستراوەکان
    - موسیقا
    - گۆرانی
    - سروود-کوراڵ
    - مارش-سەمفونی
  - بینراوەکان-ماتریالیەکان
    - پەیکەرسازی
      - ریلیف( بارز)
      - تەندار( مجسم )
      - مەداليا( میناتور )
      - دیواربەندی ( جداری )
    - گرافیك
    - وێنەکیشان
      - وێنەی مرۆڤ پورتریت-( مودیل )
      - ستیلایف
      - سروشت
      - کاریکاتیر-پوستەر
      - کولاج-زەخرەفە
      - وێنەی 3D
      - خە تخوشی
      - وێنەی کومپیوتەری
    - سیرامیك
      - سیرامیکی سارد
      - سیرامیکی گەرم
    - ماس میدیا
      - دەنگ-وێنەوێنە یجوڵاو
      - ڤیدیو-tv-
- هونەرە پیشەییەکان
  - ئاسنگەری-دارتاشی - جوانکاری ناوماڵ

## (بنچینەکانی کاری هونەری )(داهینان-جوانی-دەربرین )

کاری هونەری هەرجۆرو بەشیکی بگرین لەسەر کومەلیك بنچینە ئە نجام دەدریّت و دیتە بەرهەم بەجۆری هەرکاریّکی هونەری خاوەن بنەماو تایبە تمەندیّتی خویەتی و بەرهە مە هونەریەکەشی لە یەك جیاوازە بەلام کوّی کارە هونەری یەکان لە یەك شتدا کوّك و هاوبەشن ئەویش ئاما نجی کارەکەیە کە خزمەتکردنە بە چاوو گویی گویگرو بیسەر تاکو چیّژی تەواوی پی بگەیەنیت لەبیستنی یان بینینی کارە هونەریەکە.وە پیویستە کارەکەش ئەم سی بەشەی تیدابیت ( داهینان-جوانی –دەربرین )

*هونەری شیّوەکاری

هونەرمەند+بیروکە+کەرەستەی دەربرین( هیّل+شیّوە+رەنگ+قەبارە )= بەرهەمی هونەری( وینە+ پەیکەر+گوزە )

*هونەری نواندن

هونەرمەند+بیروکە+کەرەستەی دەربرین( جوولە-دەنگ-دیکور-شیوە )=بەرهەمی هونەری( شانویی+فیلم+دراما )

*هونەری موسیقاو گورانی

هونەرمەند+بیروکە+کەرەستەی دەربرین( دەنگ+ریتم+ئاواز+ئامیرەکان )=بەرهەمی هونەری( گورانی +موزیك )

بەم شیوەی سەرەوە هەر جوریّك لە هونەرەکان بگرین دەبینین خاوەن شیوەو چوارچیوەی تایبەت بەخویانن خاوەن کەرەستەی تایبەت بە خویانن بو دەربرین و بەرهەم هینانی کارە هونەریەکاندا بەلام لەکوتایدا دەبینین بەرهەمی کارەکە هەرجوریکیان بیت مەبەست لەجوانی بەخشین و چیژ بەخشینە بە چاوو گویّ بیسەرو بینەر .

وەبەشیوەیەکی گشتی هونەر یان داهینانی هونەری بەچەند قوناغیکی جوراو جوردا دەروات ئە مجا دەبیتە بەرهەمیك لە بەرهەمی هونەری وەك لەم هاوکیشەی خوارەوە دا دەردەکەویت :-

هونەرمەند+بیروکە+کەرەستەکانی دەربرین+ ناونیشان ———— بەرهەمی هونەر



هەرچی كاری داهینانی هونەریە بەكومەلیك قوناغدا دەروات ئەمجا دەبیتە بەرهەمیكی بینراو یان بیستراو یان بەرجەستە كراو ئەو




قوناغانەش:-

وینەی هیلكاری قوناغەكانی داهینانی هونەری

هەروەها رەگەزی( جوان )یش وەك رەگەزیكی سەرەكی كاری هونەری یەچونكە رول و كاریگەری خوی هەیە لەسەرچاوو دل و گویی بینەروبیسەر بویە دەبیت هونەرمەند لایەنی ئیستاتیكای كارە هونەریەكان لە بەرچاو بگریت وەدەبیت دەربرینی كارەكەش هەرهونەری بیت بەكەرەستەو رەگەزی تایبەت بە خوی كارە هونەریەكە دەرببریت و كاریگەری باشی هەبیت .

*مەبەستەكانی هونەر.

١-مەبەستی ئاینی واتە هونەر لەخزمەتی بلاوكردنەوەی ئاین دا بیت .

٢-مەبەستی ترس هونەر سەردەمیك لە سەردەمەكان بەتایبەتی لەچاخی بەردینی كوندا هونەری بو ترساندنی ئاژەلە درندەكان بەكارهیناوە.

٣-مەبەستی سیاسی و دەسەلاتداری هونەر بو خزمەتی پیاوانی سیاسی و دەسەلاتی پادشاكان بوو.

٤-مەبەستی پیشە واتە هونەر وەك پیشەی روژانە بەكارهاتووە لە دروستكردنی پیداویستی یەكانی مروڤدا.

٥-مەبەستی جوانكاری واتە هونەر وەك خوی نیشان بدریت كە ئاما نجی راستی هونەریش ئەمەیانە بەخشینی جوانی و چیژی تەواوە بەو كەسانەی كە سەیری دەكەن یان گویی لیدەگرن.

## ( بەندی یـــــــەکەم )

## (هونەری شیوەکاری-( فن التشکیلیه-Plastic art)

**هونەری شیوەکاری بریتی یە لە فراوانترین بەشی هونەر کە زوریك لە بەش و لقی جیاوازی لەخو گرتووە کە هەر بەشیکیان لە ریگەی جیاوازەوە دەردەبرین و دەبنەکاریکی هونەری ( بینراووبەرجەستەکراو )**

**لە هونەری شیوەکاریدا بەرهەمی هونەری بریتی یە لە بەرهەمیك کە تەنها دەبینریت و بەرجەستە دەکریت .وە ئەو کەرەستانەشی بەکاردین لە هەربەشیکی شیوەکاری بەکاردیت کەرەستەی نەجولاوو بەرجەستە کراون.**




## بەشی یەکەم

### (painting art-هونەری وینەکیشان)

**هونەری وینەکیشان/بریتی یە لە و هونەرەی کە لەکاتی کیشانیدا پشت دەبەستیت بە ( هیـــــــڵ و رەنــگ وشێوە )وە بریتی یە لەدروستکردنەوەی وینەیەکی تر وەك خوی .**



.لەهونەری وینەکیشادا بە دوو شیواز دەکیشریت ئەوانیش:-

١-وینەی خەیالی/بریتی یە لەو وینەیەی وبنەکیش ئازادەلەدروستکردنیداومەرجیش نیە بەرهەمی وینەکەوەك خوی دەربچیت.

٢-وینەی راستی ( نقل )/بریتی یە لەو جورە وینەیەی کە پیویستە وینەکیش لەکاتی کیشانیدا پابەند بیت بە وینەی بەرامبەرەوە ,دەبیت ئەو وینەیەی دەیکیشییتەوە زوری بچیتەوە سەروینە راستی یەکە.وەهەروەها لەجوری کیشانی وینەکاندا دەتوانین لە رووی شیوازی سەرەتایی وینەکەدا دیسان دوو شیوەی وینەدروستکردن بو سەرجەم جورەکانی وینە بەکاربهینین ئەوانیش:-

١-سکیج/بریتی یە لە کیشانی وینەیەك بەسادەترین شیوە واتەتەنها هیلی دەرەوەی فیگەرەکان دەکیشریت


وینەی هیلکاری


وینەی سکیج

٢-هیلکاری(تخطیط)لەم شیوەیاندا پیویستە بە تەواوی سیبەرو رووناکی سەر وینەکە بکیشریت و دیار بییت واتە دەبیت ووردەکاری تەواو لە وینەکەدا بکریت لەدانانی تونی تەواوی سەرکارەکە.

## ( رەگەزەکانی هونەری وینەکیشان-عناصرفن التشکیلیە )

هونەری وینەکیشانیش وەك سەرجەم هونەرەکانی تر لەکاتی کیشانی وینەیەکدا دەبیت پشت ببەستیت بەم رەگەزانەی لای خوارەوە :-

١-پنت-خال/بریتی یە لە بچوکترین و ووردترین رەگەزی ئینشائی وینەکیشان کە بە گورینی شوینی ئەم پنتە ماناو دەلالاتی خوی دەگوریت بو نمونە :-



٢-هێڵ /هیلەکانیش لەدوای خال و پنتەکان بە پلەی دووەم دین ئەمانیش رولیکی بەرچاویان هەیە لە وینەکێشاندا بە جوری کە بە پیکهاتەی کومەلیك هیل دەتوانریت وینە بکیشریت چەند جوریکی هەیە :-
====

١-هیلی ئاسویی ٢-هیلی ستوونی ٣-هیلی پیچاو پیچ ٤-هیلی لار ٥هیلی ریك ٦-هیلی تەریب

٣-شێوە( فورم )/شیوە بەشی کاملبووی وینەیە ئەویش بە کومەلیك هیل و پنت شیوەو فورم دروست دەبیت کە ئیتر وینە دەبیت فورم بیت وە پیویستە لە شیوەدا ئەم بەشانەی تر بەدی بکریت:

١-هیڵ ٢-رەنگ

٣-رووناکی و تاریکی ( سیبەروو رووناکی ) ٤- بەربینە(منظور) ٥-رووکار -مەلمەس( تیکسچەر )

هەرچی هیلەکانە پیشتر ئاماژەمان پیدا کە چەند جورن ( ستونی –ئاسویی-لار –ریك- پیچاو پیچ- )

*رووناکی و تاریکی( سیبەرورووناکی )

کاتێ کە رووناکی بەر تەنەکان یان فورم و شیوەو فیگەرەکان دەکەویت بیگومان شیوە کەی دەگوریت جونکە سەرجەم تەنەکان لە تاریکیدا نەدیارن نە شیوەو رەنگیان هەیە بو یە زور گرنگە رووناکی هەبیت ئیتر ئەو رووناکیە تیشکی روژ بیت یان هەر سەرچاوەیەکی تری تیشك و رووناکی دەستکرد بیت .کاتی کە رووناکیەکەش بەر شیوە کان دەکەویت سیبەر دروست دەکات کە جوری سیبەرەکانیش دەبنە دوو جور سیبەر لە بنی شیوەکاندا ئەوانیش ( سیبەری راستی و سیبەری خەیالی ) هەرچی سیبەری راستی یە ئەوە ئەو سیبەرە یە کە بە توخی لە دەوری شیوە کە دروست دەبیت بەلام سیبەرە خەیالیەکە سیبەریکی کالترە لە دەرەوەی سیبەرە راستی یەکەوە نمونە :-

**وینەی سیبەری خەیالی و سیبەری راستی سەر شیوە کان**

## ( **بەربینە**(منظور)

**یەکیکی تر لە رەگەزو بنچینەکانی هەر وینە کیشانیک ( بەربینە )یە کە ئیستا وەك زانستیکە ولەکاری ئەندازیاری دا پشتی پی دەبەستریت.ئەم رەگەزو بەشە لە وینە کیشاندا زور گرنگ و کاریگەرە چونکە گوشەو دورو نزیکی و شیوەو قەبارەی فیگەرەکان دیاری دەکات ئەمیش بە دوو شیوە دەبیت :-**

١-**بەربینەی هیلی**(منظور الخطی)

٢ -**بەربینەی رەنگی**(منظور اللونی)

**هەرچی بەربینەی هیلی یە ئەوە لەریگەی هیلەکانەوە دورو نزیکی وینەکان دیاری دەکات وە ئەوەی بەربینەی رەنگیشە لەریگەی تونەکانی رەنگەکانەوە دیاری دەکریت کە ئەو وینانەی دوورن کالترن وەبە پیچەوانەوە نمونە :-**




**وینەی بەربینەی هیلی**




**وینەی بەربینەی رەنگی**

لە بەربینەدا دەبیت رەچاوی ئەم بەشانەبین لە کیشانی وینەکان یا خود ئەوفیگەرانەی دەمانەویت بیکیشین ئەوانیش:-

١-هیلی زەوی(خط الارض)



٢-هیلی نیوان ئاسمان و زەوی



٣-خالی وون بوون

٤-گوشەی تیشکەکان.

دەبیت ئەم بەشانە هەبن ئەمجا دەبنە تەواوکەری بەربینەکە لە وینەکەدا وە دەبیت وینەکە وینەیەکی تەواو بیت وەك:- نمونە




وینەی بەربینەی هییلی کە تیایداهیلی زەوی‌وخالی وون بون دەردەخات




وینەی دەرخەری خالی وون بوون

## *رووكار ( مەلمەس )( تیكسچەر )

ئەمەش بەشیكی تر یان یەكیكی ترە لە بنچینەو رەگەزیكی تری وینەكیشان كە زیاتر بەرووكاری وینەكانەوە دیارە واتە هەروینەیەك كە دەیكیشین خاوەن رووكاریكی تایبەت بە خویەتی بونمونە نابیت رووكاری كیشانی شیوەی قوماشیك یان ئەو تونەی لە سەر قوماشیك دایدەنیین هەمان تونی سەر رووخساری پورتریتیك بیت یان نابیت ئەو تونەی كە لەسەر ستیلایفیك بە هەموو بەشەكانیەوە دایدەنیین هەمان تونی سەر خانویەك یان شاخیك بیت بەلكو دەبیت هەر شیوە و فیگەریك و خاوەن رووكارو تون و مەلمەسی خوی بیت ئیتر رووكارە كە بە رەش و سپی بیت یان رەنگاو رەنگ نمونە :-







**وینەی چەند رووکاریك بو جورەکانی وینە**

(**رەنگ و رووناکی**-الضوء واللون )



ڕەنگ و ڕووناکی یەکیکی ترن لە و کەرەستەو بنچینانەی کە لە هونەری وینە کیشاندا بەکاردین . هەرچی ڕەنگەکانە گەر ڕووناکیەکی دیاری کراو نەبیت ئەوا هیچ ڕەنگیك بە دیار ناکەویت وە هەر ڕووناکیشە کە ڕەنگەکان دیاری دەکات .

بەشیوەیەکی گشتی ڕەنگەکان ( حەوت ڕەنگە کەی ئاویزە لەگەل ڕەنگە دروستکراوەکان ئەو ڕەنگانەن کە تیایدا ڕەنگە سەرەکیەکان و ناوەندیەکان و هاو بەشەکان و ساردوو گەرمەکانی تیدا جیا دەکریتەوە وەك:-

١-ڕەنگە سەرەکی یەکان/وەك( ڕەنگی سوور-زەرد-شین )

٢-ڕەنگە ناوەندیەکان/وەك( ڕەنگی مور-سەوز- پرتەقالی )




وینەی ڕەنگە سەرەکی-ناوەندی –کونتراست-هارمون

٣-ڕەنگە هاوبەشەکان/وەك ڕەنگی ( ڕەش –سپی )

٤-ڕەنگە ساردەکان /وەك ڕەنگی( سپی –شین-سەوز )

٥-ڕەنگە گەرمەکان/وەك ڕەنگی( سوور-زەرد –پرتەقالی )

٦-ڕەنگە کونتراستەکان( دژەکان )وەك ڕەنگی( سوورلەگەل سەوز-زەردلەگەل مۆر-شین لەگەل ڕەساسی...هتد )

بیگومان ئەو حەوت ڕەنگەی ئاویزە کە بریتین لە ڕەنگی( سوور-زەرد- پرتەقالی-شین –سەوز-مور-وەنەوشەین )کە ئەم ڕەنگانەش دیسان نیوانە ڕەنگە ئەم حەوت ڕەنگە ڕەنگی تر لەخو دەگریت کە پییان دەوتریت هارمونیەکان .بونمونە لە نیوان ڕەنگی سوور ڕەنگی زەرد ڕەنگی سووریکی مەیلەو زەرد یان زەردیکی مەیلە و سوور هەیە یا لەنیوان ڕەنگی سووروشیندا ڕەنگی شینی مەیلە سوور یان سووری مەیلەو شین هەیە.وەرەنگەکان بە پیی دوورو نزیکی لەچاومانەوە ڕەنگەکان دەگورین یان بەپیی جوری قەبارەی ئەو شتەی کە ڕەنگەکەی پی کراوە بونمونە:-

١-ڕەنگی سوور تادوور بکەویتەوە دەبیتە قاوەیی پاشان جەرگی تاکو تاریك دەبیت پاشان دەبیتە ڕەش.

٢-زەرد دەبیتە قاوەیی پاشان توختر تاکو دەبیت رەش وەبە پیچەوانەوە .

٣-شین دەبیتە زەیتونی پاشان دەبیتەسەوزی تیر تاکو رەش دەبیت وەبە پیچەوانەوە.



## تیکەلکردنی رەنگەکان

بەدەر لە رەنگە ناوەندی یەکان کە لە ئە نجامی تیکەڵکردنی رەنگە سەرەکیەکان دروست دەبێت وەبەدەرلە رەنگی رەش و سپی وەك دوو رەنگ بو توخ کردن و کالکردنەوەی رەنگەکان بەکاردیت دەتوانین چەندین رەنگی تر بە کونتراست و هارمونی دروست بکەین کە خوی دەدات لە هەزاران رەنگی تر وەك :-

رەنگی سپی

| | |
|---|---|
| رەنگی قاوەیی | رەنگی سوور |
| رەنگی قاوەیی رووناك | رەنگی سەوزی گیایی |
| رەنگی پەمەیی | رەنگی شین |
| رەنگی پەمەیی کال | رەنگی زەردی تیر |
| رەنگی موری مەیلەو سوور | رەنگی پیروزەیی |
| رەنگی پرتەقالی | رەنگی موری کال |
| رەنگی ئالتونی | رەنگی زیوی |
| رەنگی ئالتونی تیر | رەنگی رەساسی |
| رەنگی کایی | رەنگی مارونی |
| رەنگی سپی تاریك | رەنگی سەوزی رووناك |
| رەنگی کەوەیی | رەنگی سەوز |
| رەنگی گوشتی کال | رەنگی مور |
| رەنگی سەوزی تیر | رەنگی پیروزەیی تیر |
| رەنگی زەرد | رەنی نیلی |




رەنگی سوور+سەوز=قاوەیی

رەنگی رەش +سپی=رەساسی

رەنگی شین+زەرد= سەوز




رەنگی سەوز+زەرد=سەوزی روناك

رەنگی شین+سەوز=شینی مەیلەو سەوز

رەنگی زەرد+سوور= پرتەقالی



رەنگی سوور+سپی= پەمەیی

رەنگی سوور+شین=مورا



## راهێنانە پراکتیکی یەکانی بەشی بنچینەکانی وینە

### راهێنانی(١)

| بابەت | بنچینە | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| بنچینەکانی وینە | هیل-شیوە ئەندازەیی یەکان-مەلەس | -قەلەم بویە –وەرەقەی h-hb-b قەلەم-A4کانسن-کانڤاس-وەرەقە | خە تخەت-خالخال-ئاسویی ستونی | شیوەی ئەندازەی بەهیلکاری و سکیچ-هاوشیوەی ئەندازەیی نمونەی شتەکانی چواردەورمان |

### راهێنانی (٢)

| بابەت | بنچینە | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| بنچینەکانی وینە | سیبەرورووناکی | قەلەم-قەلەم بویە-پاستیل –ماجیك-وەرەقە | کال و توخکردەوەی فیکەرەکان بەراستو چەپ وسادە | وینەی درەخت –جادە خانوو-میوەو شیوە جیاوازەکان بە سیبەروو رووناکی |

### راهینانی (٣)

| بابەت | بنچینە | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| بنچینەکانی وینە | بەربینە(منظور) | قەلەم-قەلەم بویە-پاستیل –ماجیك-وەرەقە | هیلەکان بەراستەو قیاسی تەواو راست و دروست | وینەیخانوو-بازار-قوتا بخانە-کورسی –مێز-دەرگا- پە نجەرە |

**راهێنانی(٤)**

| بابەت | بنچینە | کەرەستە | تەکنیک | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| بنچینەکانی وینە | رەنگ و رووناکی | رەنك بەبویەی ئاوی – روونی-وەرەقەی رەنگاو رەنگ –قوماشی رەنگاو رەنگ-کەرەستەی رەنگاورەنگ | تیکەلەیەك لەرەنگ-قوماش تیکەل کردن وەرەقە تیکەل کردن – بویە تیکەلکردن-جیاکردنەوەی رەنگەکان | شیوەیەك لە رەنك-دەموچاو رەنکردن-قوماش رەنگکردن-رووبەریك لە رەنگ-دیواریك لە رەنگ-رەنگکردنی شیوەی جیاوازو دیاری کردنی کومەلەی رەنگەکان |

## شیوازەکانی وینە

وینەکیشان بەچەندین جورو شیوازدەکیشریت و دەبینریت بویە لیرەدا شیوازەکان و جورو شیوەکەیتان بو جیادەکەینەوە.

وینە بە چەندین شیواز دەکیشریت لەوانە :-

١-**وینەی شیوەکاری**/بریتی یە لەو شیوازەی وینەیەی کە تیایدا بەشیوەیەکی تەواو وینەکە دیادەکەویت .

٢-**وینەی تەجریدی**/بریتی‌یە لەوشیوازە وینانەی کە تیایدا شیوەکان بە ناروونی و پەرش و بلاو دەردەکەون.

٣-**وینەی هیلکاری**/بریتی یە لەو شیوازەوینەیەیەی لە بە هیلکاری نەخشە دروست دەکریت.

٤-**وینەی خالخال(تنقیتی )**/ئەو شیوازەوینەیە کە تیایدا لەجیگەی هیل خالی وورد وورد دادەنریت تاکو وینەکە تەواو دەبیت.

٥-**وینەی زەخرەفی**/ئەم شیوازە بریتی یە لە وینە بە شیوە زەخرەفە واتە بەمەبەستی رازاندنەوەی روویەك.

٦-**وینەی روونکردنەوە(**توضیحی **)**/ئەو شیوازەیە لەوینە بەمەبەستی روونکردنەوەی زانستیك یان هەربابەتیك بیت.

٧-وینەی چیروك ئامیز/ئەو وینانەیە کە ناوەروکی چیروکیك نیشان دەدات.

٨-**وینەی ئەندازەیی**/ئەو وینانەیە کە ئەندازیاران بو دروستکردنی بیناو خانوو دروستی دەکەن.

٩-**وینەی کومپیوتەری**/بریتی یە لە جورە وینانەی کە بەکومپیوتەرو هەرتەکنولەجیایەك بیت دەکیشریت.

١٠-**وینەی فوتوگرافی**/ئەو وینانەیە لەریگای چاوی کامیراوە دەگیریت.

## جورەکانی ( شێوەکان )ی وینەکیشان

هەروەك پییشتر باسمان کرد هونەری شێوەکاری فراوانترین بەشی هونەری گرتووە هەربویە هەربەشیکی هونەری شیوەکاری بگرین چەندین بەش و لقی لی جیا دەبیتەوە .هونەری وێنەکێشان وەك بەشێك یان لقێك لە لقەکانی هونەری شێوەکاری یە کە چەندین جۆرو شێوەی لە خۆگرتووە .جورەکانی وێنە چەندین جوری هەیە لەوانە :-

١-وێنەی مروڤ/ئەم جورە لە وینەبریتی یە لە کێشانەوەی وێنەی مروڤ یان بەشێوەیەکی خەیالی یان بە شێوەی نقل یان لە بەر دروستکردنەوەی ئەمیش بەدوو جور :-

ا- پورترێت/بریتی یە لە دروستکردنەوەو کێشانی وێنەیمرۆڤەکە تاکو نیوەی واتە تا نیوەی مروڤەکە دەکێشین . وەك:-



پورتریتیك لەشیوەی ٣/١



پورتریتیك لەشیوەی رووبەروو

## چونیتی کیشانی وینەی پورتریت

**پیویستە لەکاتی کیشانی وینەی پورتریتدا رەچاوی هەندی شت بکەین تاکو وینەی پورتریتەکەمان تەواو بیت وەك**

**دەبیت ئاگامان لەهیلی ناوەراستی دەموچاو بیت کە لای راست و چەپ دەکاتە دوو لای یەکسان وەدەبیت چەماوەی دەموچاوەکە بکەینە سی بە ش پاشان بەشی دووەم و سی یەم بکەینەوە دوو بەشی تر بو ناوەراستی دەم و ناوەراستی چاوەکان.دەبیت ئاگامان لەوە بیت پیوانەی گویکان بەقەدەر لووتە**



چونیتی کیشانی پورتریتی مندال



وینەی پورتریت بەلا



**شیوەی دروست کردنی دەم**




**شیوەی کیشانی گویکان**



فن الرسم




Proportions of the Face
Start with a cirle, then add the chin. Erase the bottom of the circle.
Line of Symmetry
Eye line is 1/2 way up the face.
Nose line is 1/2 way between the chin and eye line.
Eye lids cover the top of the iris.
Mouth line is 1/2 between the nose and chin....or slightly higher.
Ears fit between the eye and nose lines.
Hairline
Neck starts under the ears.
Hair is above and below the top of the head.
Shirt curves around the neck.
www.expressivemonkey.com
Look for the shape of the hair. Don't draw every hair!


1. ear to ear at base of hollow
2. ear to roo of hair
3. ear to mid line above nose
4. ear to tip of nose
5. ear to mid mouth
6. ear to ch
7. chin to hair line
8. chin to nasal spine
9. chin to mid mouth
10. chin to arc of brow
11. chin to crown long diagonal
12. dep of head
13. width at cheekbones
14. jaw width at mid mouth
15. eye to eye at outer corners
16. eye to eye at inner corners
17. width of nose
18. width of mouth
19. ear tip to ear tip
20. neck width



٢-مۆدێل/بریتی یە لە کێشانەوەو دروستکردنی وێنەی مروڤ بەتەواوی واتە هەموو لەشی دەکیشری




## وینەی مودیل

دەبیت بو دروستکردنی مودیلی مروڤیك هەمیشه سەری مروڤەکه بکەینه پیوەر بو هەموو لەشی واته دەبیت هەموو بالای مودیل که دەیکیشیت (٨ )سەربیت واته بەسەری یەوە هەشت سەربیت تەواوە ئه مجا وینەی مودیلەکەما بی هەله دەبینریت.

# *وێنەی ستیللایف

**ستیلایف/بریتی یە لە دروست کردن و کێشانی وینەی هەرشتی کە نەجولاو بێت واتە لەکاتی دروستکردنیدا ئەو فیگەرەی کە دەیکیشین ناجولیت وەك( گول –گوزە –کورسی مێز-......هتد )**

**وینەی ستیلایف**



وینەی ستیلایف

## *وێنەی سروشت

وێنەی سروشت/بریتی یە لە کیشانەوەی وینەی سروشتیکی دیاری کراو دەتوانریت بەشێیوەی ( راستی-خەیالی ) وینەکە بکیشریت .بەشێوەی خەیالی یەکە لەخەیالی خوماندا وینەی سروشتیك دەکیشینەوە کە لە خەیالماندا هەلگیراوە.بەشیوەی راستیش راستەوخو دەچینە ناو سروشتەوە یان لە بەر وینەیەکی سروشتی دروستی دەکەینەوە دیسان لەم جورە وینەیەشدا بەشیوەی ستونی و ئاسویی بیکیشین بەلام لەم جورەدا زیاتر بەشیوەی ئاسویی دەکیشریت.وە لەکاتی کیشانی هەر وینەیەك بەتایبەتی وینەی سروشت و مودیل سی ئەوە ندەی نمونە ی فیگەرەکە نمونەی وینەی سروشتەکە دوربکەوینەوە .




*وێنەی پوستەر

پوستەر/بريتی يە لەو جورە وينەيەی کە لە کەمترين و سادەترين شيوەی فيگەرەکاندا زورترين ماناو واتای ناوەروك بدات بەدەستەوە ئەميش چەند جوريکن لەوانە :-

( پوستەری هونەری- پوستەری بازرگانی –پوستەری تەندروستی- پوستەری سياسی- پوستەری هاتووچو )













وينەی هەندی شيوازی پوستەر

## *وێنەی کاریکاتێر

وینەی کاریکاتیری/بریتی یە لە جورە وینانەی کە لەکاتی دروستکردنیدا زیادە رویی تیدا دەکریت بە مەبەستیکی دیاری کراو نمونەی ئەم جورە وینانەش لە روژنامەو گوڤارەکاندا بلاو دەکرینەوە بە مەبەستی رەخنەگرتنبەشیوەیەکی تەنز ئامیز.وەك:-






## *وینەی کولاج

کولاج/بریتی یە لە دروستکردنی وینە لە ریگەی بەکارهینانی وەرەقەی رەنگاو رەنگ و لکاندن و کوکردنەوەی وینە و لەگەل یەکتری واتە دەبیت لە دروستکردنی وینەی کولاجیدا قەلەم بەکارنەبیەت هاو شیوەی وینەی قەلەمی .

ئەم جورە لە وینە دەتوانریت هەموو شتیکی تیدا بەکاربهینریت بو دەرخستنی شیوەیەك .لە هونەری کولاجدا هەندی جار لە وینەی کولاجدا بەدەرلە وەرەقەی رەنگاو رەنگ وینەی روژنامەوگوڤارەکان لە دەوری یەك دادەنریت بەمەبەستیکی دیاری کراو دەبیتە وینەی کولاجی .




وینەی پورتریتیك بەکولاج — وینەی مودیلیك بە کولاج

## *وینەی کومپیوتەری

وینەی کومپیوتەری/بریتی یە لەو جورە وینانەی کە لەدروستکردنیدا بەرنامە کومپیوتەریەکان بەکاردیت لە نمونەی فوتوشوپ .سری دی-...هتد بویە ئەم جورە وینانە ئاسانتر دەنەخشینرین . نمونە




نمونەی وینەیەکی کومپیوتەری

## ( وینەی سیّ دووری )

*3D/بریتی یە لەو جورە وینانەی کە سی دووری لە وینەکەدا دەبینریت .واتەهاوشیوەی پەیکەر سازی

لەم جورە وینانەدا چاو بەجوری وینەکە دەبینی لە دوری یەك یان قولی یەك بەدەر لە دریژی و پانی وینەکە دەبینیت ئەویش لە ریگەی بەربینەی هیلی یان بەربینەی رەنگیەوە بەجوریك وینەکە زور لە راستی یەوە نزیك دەبیت وەك:-








نمونەیەك لە وینەی سی دووری

## *وینەی زەخرەفە



*هونەری زەخرەفە/بریتی یە لە و هونەرەی کە بو رازاندنەوەی چوارچیوەیەك روویەك وینەیەك بەکاردیت ئەویش بەم شیوانەی لای خوارەوە :-

١-زەخرەفەی ئەندازەیی/بریتی یە لە بەکارهینان و دووبارە کردنەوەی شیوازە ئەندازەییەکان.

٢-زەخرەفەی سروشتی /دووبارەکردنەوەی شیوەکانی سروشتە وەك( گول و گەلا-لقی دار..... )لە زەخرەفەکەدا دووبارە دەبیتەوە .

٣-زەخرەفەی تیکەل/بریتی یە لە دووبارەکردنەوەی شیوازە ئەندازەیی و سروشتی یەکان.




*رەگەزەکانی زەخرەفە/هونەری زەخرەفە لەم رەگەزانە پێك دێت:-

(هاوسەنگی-چونیەکی-بەیەکداچووون تێکەلاوی-لەگەل یەك گونجان-دووبارە بوونەوە-لق لق-گورینەوە-بەرامبەرکی)



وێنەی هەندی زەخرەفە

## هونەری خوشنوسی(خطاطی)

*هونەری خە تخوشی/ئەو هونەرەیە بو جوان نوسین بەکاردیت چەندین جوری خەتی نوسین هەیە لەوانە :-

(روقعە-نوسخ-سولس-فارسی(نستعلیق)-کوفی(کوفی سادە-کوفی ئەندازەیی -کوفی ئالوز-کوفی گولدار)-

دیوانی-جەریدەیی-کومپیوتەری )















## *کەرەستەکانی وینەکیشان

بیگومان بو دروستکردن و کیشانی وینە پیویستمان بە چەندین جور لە کەرەستەی هەمە جور دەبیت لەوانە :-

٢-وەرەقە (وەرەقەی سادە-کانسن-کانڤاس-)

٣-چوارچیوە(فریم)+خام و قوماش

٤-بویە لەجورەکانی (رۆنی-ئاوی- پاستیل-گواش-ئەکرلیك- پوستەری-قەلەم بویە-ماجیك-)

٥- پالیت/ئەو رووەی کە رەنگەکانی لەسەر تیکەل دەکریت.

٦-بوردو ستاند/ئەو دوو ئامیرەن کە تابلوکەی لەسەر رادەگیریت.

٧-فلچە/دەکرینە دووجور ( فلچەی ئاوی-فلچەی رونی )ئەمانەش بەشیوەی باریك و ئەستوورن

٨-فەحم ( خەلوز )

ئەمانەو چەندین جوری تر لە کەرەستە لەوینەکیشاندا بەکاردیت.



ستاند ستاند ستاند بورد فلچەی بویەی ئاوی















پاستیل قەلەم بویە فحم قەلەمی هەمەجور قەلەمی رەساسی وینەکیشان















وەرەقەی کولاج چەقوی رەنگ بویەی گواش قەلەمی دار بویەی ئاوی











تەربەنتین بوتیکەلی رەنگ پالیت بویەی رونی بویەی پوستەر فلچەو بویەی ئاوی



ماجیك



فلچەی هەمەجور

هەندی ووردە پێویستی وینە

***راهینانە پراکتیکیەکانی بەشی جورو شیوازەکانی وینە.:**

***راهینانی (١) (وینەی پورتریت)**

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| شیوازو شیوەکانی وینە | بینراو (بەشیوەی خەیالی و راستی) | قەلەم-فحم- قەلەم بویە | بەهیلی سادە و قەلەم لەسەر وەرەقەی بەهیلی ووردبەشیوەی (سکیچ-هیلکاری) | وینەی پورتریت-بەش بەش (قیاسی چەماوەی سەر –چاوەکان-لووت و گوی-دەم) پورتریت لە جولەی جیاوازدا (رووبەروو لا سی یەك |

***راهینانی (٢)(وینەی مودیل)**

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| شیوەو شیوازەکانی وینە | بینراو (خەیالی و راستی) | قەلەم-فحم- قەلەم بویە | بەهیلی سادە و قەلەم لەسەر وەرەقەی بەهیلی ووردبەشیوەی (سکیچ-هیلکاری) | وینەیمودیل-بەش بەش(قیاسی بەشەکانی بالاو دریژی دەست و قاچەکان و مودیل لەجولەی جیاوازدا |

*راهینانی (٣)(وینەی ستیلایف)

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| شیوەو شیوازەکانی وینە | بینراو (خەیالی و راستی) | قەلەم-فحم- قەلەم بویە-بویوی ئاوی و رونی و پاستیل | بەهیلی سادە و قەلەم لەسەر وەرەقەو فریمی جیاواز -وەرەقەی کانڤاس و کانسن بەهیل و تونی ووردبەشیوەی (سکیج-هیلکاری) | کیشانی وینەی ستیلایف بە شیوە ی ستونی و ئاسویی نمونەی دانراو یان دروستکردنەوە یان خەیالی |

*راهینانی(٤)(وینەی سروشت)

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| شیوەو شیوازەکانی وینە | بینراو (خەیالی و راستی) | قەلەم-فحم- قەلەم بویە-بویوی ئاوی و رونی و پاستیل-رەنگە جیاوازەکان | بە قەلەم -فەحم-بویەی روونی-ئاوی -پاستیل بەشیوەی زەربات-تەنقیتی-فلچەی باریك-پان | کیشانی وینەی سروشت بەشیوەی ستوونی و ئاسویی |

*راهینانی (٥)(وینەی پوستەر)

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| شیوەو شیوازەکانی وینە | بینراو (خەیالی و راستی) | قەلەم-فحم- قەلەم بویە-بویوی ئاوی و رونی و پاستیل-رەنگە جیاوازەکان | بەکەمترین رەنگ و کەرەستەی جیاواز | کیشانی وینەی پوستەریك هونەری بیت یان سییاسی یان بازرگانی |

*راهینانی( ٦ ) وینەی کاریکاتیر )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| شیوەو شیوازەکانی وینە | بینراو ( خەیالی و راستی ) | قەلەم-فحم- قەلەم بویە-بویوی ئاوی و رونی و پاستیل-رەنگە جیاوازەکان | رەنك و رەش وسپی پاندانی سوفت و رەنگی ئاوی | کیشانی وینەی کاریکاتیری جیاواز هەریەکەیان باس لە رووداویك یان کیشەو مەسەلەیەك بکات |

*راهینانی ( ٧ ) وینەی کولاج )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| شیوەو شیوازەکانی وینە | بینراو ( خەیالی و راستی ) | کاغەزی رەنگاو رەنگ –وینەی جەریدە-کەتیرە-مەقەست-وینی معامەلات - | ووردکردن و لکاندنی بەرووەیەکدا-برینی فیگەری جیاواز و لکاندنیان بەروویەکدا- | کیشانی وینەی کولاج بەشیوەی جیاواز |

*راهینانی( ٨ )( وینەی کومپیوتەری )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| شیوەو شیوازەکانی وینە | بینراو ( خەیالی و راستی ) | کومپیوتەر-تەبع-بەرنامەی فوتوشوپ-کامیرای ففوتوگرافی | بەختستنە پال یەکی هەندی لەقتەی وینەیی و دروستکردنی ئینشایەکی وینەیی | کیشانی وینەی یەکی کومپیوتەری |

*راهینانی ( ٩ )وینەی( سی دووری )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| شیوەو شیوازەکانی وینە | بینراو ( خەیالی و راستی ) | رەنگی ئاوی –زەیتی –پوستەری - پاستیل | بەووردی وبەکارهینانی مەنزوری تەواو کیشانی لەسەر رووی جیااواز وەك دیوار زەوی –بەگوشەی جیاواز | کیشانی وینەی سی دووری بەشیوەی پروژە |

## بەشی دووەم

## ( هونەری پەیکەر سازی-فن النحت-Sculptuer)

*هونەری پەیکەرسازی/یەکیکە لە هونەرە بینراوەکان کە لەدروست کردنیدا پشت دەبەستی بەکەرەستەی جیاوازولەریگەی( قەبارە-بوشایی – مەلمەس –رووبەر)بە چەند جوریک.دروست دەکریت.



نمونەی کاریکی پەیکەری

هونەری پەیکەرسازی هەروەك چون هونەری وینەکیشان لە چەندین ریگەی جیاوازو شیوەی جیاوازەوە دروست دەکری‌ونیشان دەدریت لەگەل بەکارهینانی ئارمیچەرو ستاندو کەرەستەی تر بە هەمان شیوە پەیکەرسازیش چەندین شیوازوو جوری جیاوازی هەیی لەوانە

١- پەیکەری تەندار-( مدور )/بریتی یە لەو جورە پەیکەرانەی کە لەدروستکرن و بینینیدا هەموو رووەکانی دەبینریت و دروست دەکریت وەك پەیکەری ئازادی لە نیورك.

٢- پەیکەری هەلتوقیو-بارز- ریلیف/بریتی یە لەو جورە پەیکەرانەی کە لە دروستکردن و بینیدا تەنها یەك رووی دروست دەکریت و ددەبینریت ئەمیش بە شیوەی بچووك و بەشیوەی دیوار بەندی کە رووبەرەکەی فراوانترو گەورە ترە دەبینریت.

٣- پەیکەری هەلکولراو-غائر/بریتی یە لەو جورە پەیکەرەی کە لە دروستکردن و بینینیدا لەسەر رووەکە هەلدەکولریت واتەبە پیچەوانەی پەیکەری ریلیف.

٤- پەیکەری میناتور/بریتی یە لەوجورە پەیکەرانەی بەشیوەی قەبارەی بچووك دروست دەکرین بو مەبەستی تایبەت وەك( خەلاتی ڤیستڤال و خەلاتی وەرزشی ...هتد )

٥- پەیکەری مەدالیا/بریتی یە لە بچوکترین شیوەی پەیکەر کە بە تەکنیکیکی وورد کاری تیدا دەکریت.

٦- پەیکەری زیندو/ئەو پەیکەرانەیە کە راستەوخولەریگەی کەرەستەو مەلەسی تایبەتەوە مروڤیکی زیدوو رەنگ دەکریت لە شیوەی پەیکەری برونزی –مسی ................هتد

وەدەتوانریت پەیکەر لە ریگای جیاوازو کەرەستەی جیاوازەوە دروست بکریت و نیشان بدریت لەوانە :-

( پەیکەری برونزی-جیمەنتوی سپی–بەرد-دار-مس-فاپیەرگلاس- پەیکەری روبوتی......هتد )هەروەها پەیکەر بە دوو ریگەی جیاواز بو سەرجەم جورەکانی پەیکەر ئە نجام دەدریت ئەوانیش :-

١ریگای دانانی کەرەستەکە لەسەر رووەکە واتە بەدانانی هەرجورە کەرەستەیەکی تایبەت پەیکەرەکە دروست دەکەین.

٢- لیگرتن و داتاشینی کەرەستەکە تاکو دەرکەوتنی شیوەکە .واتە کەرەستەکەمان هەیە لە ریگەی لیگرتن و لیکردنەوەی بە شیکی کەرە ستە سە رەکی یە کە شیوەی پەیکەرەکەمان بو دەردەچیت.

لەهونەری پەیکەرسازیدا هەموو جورەکەرەستەیەك بەکاردیت بەتەکنیکی جیاجیابو دروستکردنی پەیکەریك .



راهێنانە پراکتیکیەکانی بەشی پەیکەر

*راهێنانی (١)( هەڵکولینی شێوەو وێنەی جیاواز لە سەر ڕوویەك-ڕیلیف )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| پەیکەری ڕیلیف | بینراووبەرجەستەکراو ( خەیالی و راستی ) | ڕووی جیاواز وەك( بورەك-گەچ-فاییەر تەختە دار-بەردی تەخت-بویەسپرا-قوری سەناعی قوری ئاسایی | هەڵکولینی ڕوویەك و دەرهینانی فیگەری جیاوازلیی-دانانی مادەیەکی جیاواز لە ڕووەکە | دروستکردنی پەیکەری ڕیلیف-فیگەری جیاواز-نوسین –زەخرەفە لەسەر ڕوویەك |

*راهێنانی (٢)( داتاشینی کەرەستەیەك ودروستکردنی شێوەی جیاواز-( تەندار )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| پەیکەری تەندار | بینراووبەرجەستەکراو ( خەیالی و راستی ) | کەرەستەی جیاوازوەك( – قوری سەناعی و ئاسایی-بورەك-گەچ-فاییەر-تەختە دار-بەردی تەخت-تەل –ئاسن-تە پەدور | داتاشینی کەرەستەیەکیان دانانی کەرەستەیەك بەدەوری کەرەستەیەکی ترداو دروستکردنی شێوەی جیاواز | دروستکردنی پەیکەری تەندارلەشێوەو حەرەکاتی جیاوازدا. |

*راهێنانی (٣)( دروستکردنی پەیکەری ئازاد )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| پەیکەری ئازاد | بینراووبەرجەستەکراو ( خەیالی و راستی ) | کەرەستەی جیاوازوەك( – قوری سەناعی و ئاسایی-بورەك-گەچ-فاییەر-تەختە دار-بەردی تەخت-تەل –ئاسن-تە پەدور | هەرجورە ڕیگایەك دەتوانریت-تەکنیکی تیکەل | دروستکردنی پەیکەری جیاواز لەشیوەو قەبارەدا |

## بەشی سی یەم

## (هونەری سیرامیك-فن الخزف- ceramic art)

سیرامیك/بریتی یە یەکیکی تر لە هونەرە بینراوەکان کە لە دروست کردن و نیشاندان و بینینیدا پشت دەبەستیت بە (قەبارە-بوشایی-مەلمەس – بویە و شوشە )ئەم هونەرەش بەگشتی بە دوو ریگا و دوو شیوە ئە نجام دەدریت ئەوانیش:-

١-سیرامیکی سارد:-بریتی یە لە وجورە سیرامیکەی کە لە دروستکردنیدا جورە هەویریکی تایبەت بەکاردیت کە پیوییستی بە فرنی تایبەت نیە بو ووشك بوونەوەی پاش ماوەیەك لە دروستکردنی ووشك دەبیتەوە.

٢-سیرامیکی گەرم:-بریتی یە لە وجورەی سیرامیك کە لە دروستکردنیدا جورە قوریکی مەتاتی تایبەت بەکاردیت کە پاش دروستکردنی فیگەرە سیرامیکیەکە پیویستی بە فرنیکی تایبەت هەیە تاکو ووشك دەکریتەوە و پاشان شوشەو رەنگی تایبەت دەکریت .لە دروستکردنیدا ویلی سیرامیکی و پالیت و ئامیری تر بەکاردیت.





سیرامیکی گەرم

سیرامیکی سارد









وینەی چەند شیوەیە و نمونەیەکی سیرامیکی گەرم

*راهینانە پراكتیكیەكانی بەشی سی یەم ( سیرامیك )

* راهینانی ( ١ ) شییوەیەك لە سیرامیكی سارد )

| بابەت | هونەر | كەرەستە | تەكنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| سیرامیكی ساد | بینراووبەرجەستەكراو ( خەیالی و راستی ) | قوری سەناعی –هەویری سیرامیككی-هەویری كاغەز- پلاستەر | دروستكردنی گولی وورد بەهەویر | گولی وورد بو ناوگوزەو قاپ |

*راهینانی( ٢ ) شیوەیەك لە سیرامیكی گەرم )

| بابەت | هونەر | كەرەستە | تەكنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| سیرامیكی گەرم | بینراووبەرجەستەكراو ( خەیالی و راستی ) | قوری سەناعی –هەویری سیرامیككی-هەویری كاغەز- پلاستەر | گوزەو قاپ | دروستكردنی گوزەیەك |

## بەشی چوارەم

## (هونەری گرافیك-Graphic art)

**گرافیك/بریتی یە لە هونەری تەبع و چاپكاری واتە چاپكردنی وینەو نوسینیك لەسەر روویەك ئەو رووەە قوماش بیت یان معاكس یان پلاستیك بیت بەدوو شیوە گرافیك دەكریت ئەوانیش ( رەش و سپی و رەنگاو رەنگ )**



وینەی گرافیكی رەش و سپی



وینەی رەش و سپی و رەگاورەنگ




گرافیكی رەنگاو رەنگ

***راهینانی بەشی چوارەم( گرافیك )**

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| شیوەی گرافیك | بینراووبەرجەستەكراو ( خەیالی و راستی ) | پلاستیك-معاكس-مرەكەبی رەش و سپی - رەنگاورەنگ | هەلكەندن و زبركردنی رووی معاكس و پلاستیكەكەیان هەلكولینی فیگەرەكە لەسەری | درەستكردنی شیوەیەكی گرافیكی لە سەر وەرەقەو لەسەر قوماش |

## بەشی پینجەم

## (هونەری دەستی-Hands Craft)

**هونەری دەستی/بریتی یە لەو هونەرەی كەزیاتر شیوەیەكی پیشەیی لە خو گرتووە واتە روالەتی كوی هونەرەكانی لە خو گرتووە.ئەویش لە ریگەی بەكارهینانی كەرەستەی جوراو جورەوە ئە نجام دەدریت.**





**وینەی كاریك بەكتیب**

**دروستكردنی دیمەنیك لەسەر گەلای دار**



**دروستكردنی خانوو بە پاررچە تەختە**




شیوه مشاریك لەسەر نوكی قەلەم    لەریگەی بەكارهینانی هەنددی شتەوە وینەی مزگەوت   دروستكردنی مالیك لەناوكتیب




## *راهینانی بەشی پینجەم( كاری دەستی )

### *راهینانی كاری دەستی ئازاد

| بابەت | هونەر | كەرەستە | تەكنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| كاری دەستی | بینراووبەرجەستەكراو ( خەیالی و راستی ) | كەرەستەی جوراو جور – دار تە پەدور –تەختە- كارتون.....هتد | بەكارهینانی تەكنیكی جیاوازوهەمەجور | نمونەی جیاواز |

## بەشی شەشەم



### ( - هونەرەكانی ماس میدیا )

### ( Mixed Media )

**ماس میدیا/بریتی یە لە هەموو ئەو هوكارانەی كە وینەو رەنگ و دەنگ و نوسین دەگەیەنیت بە بیسەرو بینەر لەوانەش( دەق( نوسین )( چیروك_هونراوە- پەخشان-رومان –داستان-ژیاننامە )-وینە-وینەی جولاو-ڤیدیو-تەلەفیزیونی ( ناوخویی و ئاسمانی )-رادیو-تسجیل-كومپیوتەر –شاشەی تایبەت.....هتد**

***هونەری كومپیوتەر-( فنون الكومبیوتر-( فن الرقمی )**

**ئەو هونەرە یە لەریگەی بەرنامەی تایبەتی وەك بەرنامەكانی ( فوتوشوپ-سری دی-ماكس ستودیو-سیینەمافوردی-چەندان بەرنامەی تری هەمەرەنگەوە هونەرەكان نیشاندەدریت و بەرهەم دەهینریت.**

***راهینانی پراكتیكی بەشی شەشەم( نوسین**

| بابەت | هونەر | كەرەستە | تەكنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| بەرهەمی نوسین | بینراووخویندراو | ووشە+رستە | هەمەرەنگی ووشە-وەسف | نوسینیكی جوان چیروك-رومان-بابەت....هت |

## بەشی حەوتەم




(هونەری دیزاین-تصمیم (Designing

دیزاین/بریتی یە لە جوان ریکخستن و رازاندنەوەی روویەك رووبەریك شوینیك بەرگیك رووی دەرەوەی خانویەك ئوتومبیلیك رازادنەوەی جل و بەرگ........هتد وەدیزاین لە هەمووسەردەمیکدا بنچینەی هەر کاریکی هونەری بووە.وەدیزاین ئەم کەرەستانەو ئەم رەگەزانە تیبیدا بەردەوام دووبارە دەبیتەوە ( هیل-شیوە-رەنگ-کەرەستە( خامە ) )

دیزاین هەمیش پیویستی یەکی دووببارەی ژیانمانە بویە پیویستە هەمیشە ئاگاداری سەرجەم بوارە جوربە جورەکانی ژیانمان بین و دیزاینی تایبە تمان هەبیت بو هەموو شتیکی ژیانمان.





بەکارهینانی دیزاین لەچونیتی ریکخستنی ژوریك دیزاینی ژوریك

## *راهینانە پراکتیکیەکانی بەشی حەوتەم( دیزاین )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| بەرهەمی دیزایین | بینراووبەرجەستەکراو | کەرەستەی هەمە رەنك | رازاندنەوەوجوانکردن و ریکخستنی پەیوەندیەکان- | رازاننەوەی بەرگیك- دیزاینکردنی جلوبەرك- دیزاینکردنی رووپەك- دیزاینی دەم وچاو- جانتا...هتد |

## ( ریبازە هونەری یەکان-شیوەکاری )

هونەر بەگشتی و هونەری شیوەکاری بەتایبەتی سەرجەم بە رهەمە هونەریەکان لەسەر یەك شیوە دروست ناکری و ناکیشری بەلکو لەسەر چەندین جور لەستایل و ریبازو شیوەو قوتا بخانەی جیاجیادەبیتلەوانە :-

### ١-ریبازی کلاسیك( کلاسیزم )

بریتی یە لە وریبازەی کە هونەرمەندان لەسەر کومەلیك ریساو یاسای تایبەت کارەکانیان ئە نجام داوە کە رولەتیکی ئاینی و پاشایی پیوە دیار بووە.وە ئەم ریبازە کومەلیك لە هونەرمەند وەك زینوو کردنەوەی هونەری( رومانی و ئیغریقی )هەستان بە دروستکردنی و چەندین هونەرمەند لەسەر ئەم ریبازە کارەهونەریەکانیان ئە نجام داوە لەوانە( مایکل ئە نجیلو بە کاری پەیکەری داودو لیونارد‌و داڤینشی بەکاری مونالیزا- جیوکوندا-وەهونەرمەندانی تر ( تیتان( وینەکیش )-رافیل( وینەکیش )-داڤید-( پەیکەرساز )ئەنگەر( وینەکیش )...هتد )سەربەم ریبازەن.

### ٢-ریبازی رومانتیك( رومانسیزم )

ئەم ریبازەش لەکوتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نوزدەهەم دەرکەوت ئەویش لەگەل دەرکەوتن و پیشکەوتنی زانست و زانیاری.ئەم ریبازە پشتی دەبەست بە خەیال و ئەندیشەی هونەرمەند واتە هونەرمەند تیایدا ئازادبووە بە پیچەوانەی ریبازی کلاسیکەوە کە هونەرمەند پابەندی کومەلیك رریساو یاسای تایبەت بووە لە شیوەو قەبارە ی کارە هونەریەکەیدا .ئەم هونەرمەندانەشی سەر بەم ریبازەن هونەرمەندان( یوجین دیلاکروا-( کەشتی میدوزا )-جریکولد-تیرنەر.....هتد )کە زوریك لە هونەرمەندانی تر لەسەر ئەم ریبازە کارە هونەریەکانیان ئە نجام داوە .

٣-ریبازی ریالیزم( واقعی )

ئەم ریبازەش وەك كاردانەوەیەك دژی ریبازی رومانتیك هاتە ئاراوە چونكە لە ریبازی رومانتیك دا هونەرمەند زور خەیالی و بەشیوەیەكی فەنتازی بەرهەمەكانیان ئە نجام داوە بەلام لەم ریبازەدا هونەرمەند زور واقیعیانە كاری لەسەر راست روداوەكان كردووە و لە كارەكانیاندا زور بەرونی و راستی دوور لە خەیال و ئەندیشە نیشان دراون. هونەرمەندانی ئەم ریبازەش( كوربی( كاری مەرسەم )وكاراڤاجیو-هارولد جیلمان-ئەندریە دیرین...هتد )

٤ -ریبازی ئینتباعی( ئیكسپریشینیزم )

ئەم ریبازەش جیاوازیەكی هەبیت لە گەل ریبازەكانی تردا هونەرمەندانی ئەم ریبازە بو كیشان و دروستكردنی كارە هونەریەكانیان لەجیی مەرسەم یان ستودیوی كارەكانیان راستەو خو هاتنە ناو سروشت و لەبەر روناكی تیشكی روژ وینەبكیشن زیاتریش بەرهەمەكانیان وینەی سروشت بووە هونەرمەندانی ئەم ریبازەش ( ئیدوارد مانیە- پول سیزان-رینوار –كلود مونیە-سیسل.هتد )چەندان هونەرمەنی تر .

٥-ریبازی تەجرید ( ئەبستراكت )

ئەم ریبازە لە كارە هونەریەكاندا بەتایبەتی هونەری رەنگ و وینەكیشاندا لەروانگەیەكی ئەندازەیی و شیوە ئەندازەیی یەكانە وە شیوەی دیمەنەكان دەگوریت بو بازنەو چوارگوشەو لاكیشەو هیللی جوراو جور.فیگەرەكان لە تابلویەكی هونەریدا بەشیوەی پەلە پەلەو خەورو خالی ووردد دەردەكەویت.ووشەی ( ئەبستراكت-تەجرید )واتە دووركەوتنەوە لە واقع و دابراولیی ونیشاندانی راستی بە جوریكی تر .هونەرمەند( كاندنسكی ) توانی لەتابلوی ( تكوین )سالی ١٩١٤كە روحی كردبوو بەبەری چوارگوشەو لاكیشە و هیلە جواراو جورەكانی ناویدا هونەرمەندانی تری وەك( موندریان-جاكسون بولوك ) خزمەتیان بەم ریبازەكردووە.

٦-ریبازی تەكعیبی( كوبیزم )

ئەم ریبازەش كارەهونەریەككانی لەریگەی دروستكردنی دیمەنی سروشتی و مروڤ و ئاژەل لەریگەی بەكارهینانی شیوە ئەندازەیی ییەكانەوە واتە تابلوكانی ئەم ریبازە بەشیوەی ئەندازەیی جوراو جور دروست دەكرین.ئەم ریبازە بنچینەی كارەە هونەریەكان شیوەی ئەندازەیی یە.

هونەرمەند( سیزان )بەدامەزرینەری ئەم ریبازە دادەنریبت دەلی( هەموو شتی لە سروشتدا شیوەی ئەندازەیی یە )وەهونەرمەند ( پا پلو بیكاسو )بەدریژە پیدەری ئەم ریبازە دادەنریت.لەگەل هونەرمەندان( جورج براك-خوان جریس-مارسیل دوشامپ )لەم ریبازە كارەهونەریەكانیاانن ئە نجام داوە

٧ -ریبازی سریالی/

لەسەرەتاو ناوەراستی سەدەی بیستەم لە وولاتی فەرەنسا درروست بوو ئەم ریبازە لەكارە هونەریەكانیدا پشت بە شیوەی خەیالی و پشتەوەی سروشت و واقیع و خەونە كان واتە شیوەو فیگەری كارە هونەیەكانی ئەم ریبازە بەشیوەی ناسروشتی دەردەخریت و دەكیشریت.

لەهونەرمەندانی ئەم ریبازەش( ئەندریە بریتون-ساڤادور دالی-ماكس ئیرنست-ئیف تانجی-رینیە ماگریت )

٨-ریبازی داهاتوو خوازی( فیوچەریزم )/

ئەم ریبازەش لەوولاتی ئیتالیا سەری هەلداو پاشان گوازراوەتەوە بوو فەرەنسا ئاما نجی ئەم ریبازە ( بەرەنگارو هەولی رابردووی داوە بو ئەوەی داهاتووی پی ناوبنیت.هونەرمەندانی ئەم ریبازەش( بوکشیونی-کارلوکارا-جیاکوموبالا )

هەروەها چەندین ریبازو قوتا بخانەی تری هونەری دروستبوون کە کارە هونەریەکان و جوارو جوری کارەکانیان لەسەر کراوە لەوانە :-

( ریبازی هیماکاری( سیمبولیزم )-ریبازی تەربررینخوازی( ئیکسپریشینیزم )- پوپ ئارت-هونەری سلەیشن )

چەندین ریبازی جوراو جوری تر.

بیگومان ئەم ریبازانە یەك بە دوای ئەوی تریاندا هاتووەو هەریەکەیان خاوە خاسیەتێکی تاییەت بەخویەتی .



تابلوی ( جیرنیکا )ی پا پلو بیکاسو



تابلوی مونالیزا کەلەسەررسیبازی کلاسیك



تابلویەك لەسەر ریبازی کلاسیك



تابلویەك سەربەریبازی رومانتیکی



تابلویەك سەربەریبازی رومانتیکی



تا بلویەك لەسەر ریبازی سوریالیزم کیشراوە

تا بلویەك لەسەر ریبازی سوریالیزم کیشراوە



تابلویەك كە لەسەر ریبازی ئینتباعی کیشراوە

تابلویەك لەسەر ریبازی تەجرید کیشراوە

## بەنـــــــدی دووە م



( هونەری شانوگەری-دراما –سینەما )




## بەشی یەکەم

(هونەری شانوگەری-Theater art)

هونەری شانویی و نواندن هەروەك چون هونەرەکانی تر سەرەتایەکی هونەریان هەیە بیگومان ئەمیش سەرەتایەکی میژوویی هەیە .بەدەر لە وەی مروڤ هونەری نواندنی پیش قسەکردن ختسووە لەسەردەمەسەرەتایی یەکانی ژیانیدا سەرەتای ئەم هونەرە دەگەریتەوە بو سەردەمی وولاتی ( یونانی کون-ئیغریق ) لەسەردەستی سی بیرمەند و فەیلەسوف و هونەرمەندی ئەو کات ئەوانیش( ئەرستوڤانیس-یوریپیدس ئەسخیلوس )

وەیەکەم ئەکتەریش لەمیژووی ئەم هونەرەدا ( سیسبس )بووە .بەشیوەییەك ( ئەسخیلوس )بویەکە مجارتوانی دوو هونەرمەندد دوو ئەکتر بهینیتە سەرتەختەی شانو لەمیژوودا پاشان( سوفوکلیس )یش توانی بو یەکە مجار سی ئەکتەری بهینیتە سەر تەختەی شانو لە میژوودا .ئیتر بەم جورە هونەری نواندن سەرجەم وولاتانی تری دنیای گرتەوە .







ئەسخیلوس یورپیدس سوفوکلیس

*شانوی ئینگلیز/لەسەدەی نوزدەهەم دا هونەرمەند( بادموندکین ) یەکەم ئەکتەربووە لەسەرتەختەی شانو بەنیوسەدە پاش ئەم ( لورد بایرن )بووە

*شانوی فەرەنسی/لەسەرەتای سەدەی هەژدەهەمەوە ( مولیرو میشیل بارون-روسیسکاس )بویەکە مجار هاتونەتە سەر تەختەی شانوهەروە ( حسناو ئەدریان-سارە برنار)

*شانوی ئەمریکی /شانوی ئەمریکی لەسەردەستی سی ئەکتەر دامەزراوە ئەوانیش( ئەدوین فورست-ادوین ببوس-جوزیف جیفرسون )

هەندی لە پیشەنگانی ئەم هونەرە و هەندی لەبیرمەندو فەیلەسوفان دەلین ( نواندن لەدایك دەبیت نەك دروست بکریت )واتە بەهرەەو مەوهیبەیە .هەندیکی تر دەلین هونەری نواندنیش وەك سەرجەم هونەرەکانی تر لە ریگەی تەمرین و راهینان و پروڤەی بەردەوامەوە دەتوانین فیری ئەم هونەرە ببین.

بیردوزو میتودەکانی هونەری نواندن بۆدوو قوتا بخانە و دوو میتود دابەش دەبن ئەوانیش:-

١-قوتا بخانەی پیتی دەستکرد( المدرسة الحرفية الالية)

ئەم قوتا بخانەیان زیاتر تەرکیزی لەسەر رووی دەرەوەی ئەکتەرو بەکارهینانی لەش و دەنگ وئاماژەی دەست و دەم وچاوو جوری شیوازی پیتەکانی حیوارەکەی ئەکتەرەکە دەکات.

٢-قوتا بخانەی ناخی و داهینانی( المدرسةالنفسية ولابداعية)

ئەم قوتا بخانەیە زیاتر تەرکیزی لەسەر ناخی ئەکتەرەکەیە وەك تیگەشتن و غەریزەو هەلسوکەوتی دەروونی ئەکتەرەکەی

بوکارە شانوییەکە یان درامیەکە.م/

*شانوگەری/بریتی یە لە نمایش کردنی روداویك یان بەسەرهاتی یان دیمە نیك لەلایەن چەند ئەکتەریکەوە یان یەك ئەکتەرەوە بەم شیوازانەی لای خخوارەوە .

١-مونودراما/بریتی یە لەو جورە شانویی یەی کە تەنها یەك ئەکتەر رولی تیدا دەگیریت.

٢- پانتومایم/ ئەو جورەشانویی یەیە کە تەنها ئاماژەی تیدا بەکار دی بەبی دەنگ.

٣-ئوپەریت /بریتی یە لە و جورە شانوییانەی کەلەحیواری ئەکتەرەکاندا شیعر بەکاردیت واتە حیواری شیعریەو زیاتر روویەکی مندالانەی هەیە.

٤-شانویی بوکەلە/بریتی یە لەو شانوییانەی لەجیی ئەکتەر بوکەلەی تیدا بەکاردیت.





وینەی دیمەنیك لە شانویی ئوپەریت شانویی ئوپەریت

لەرووی ناوەروکەوە هەربەشیکی نواندن بگرین بەم شیوانەیە :

١-کومیدیا( بەزمەسات )/ئەو جورە شانوییانەیە کە بە خوشی دەسپیدەکات و بە خوشی کوتایی دیت .

٢-تراژیدیا( مەرگەسات )/ئەو شانوییانەیە کە بەناخوشی دەسپیدەکات و کوتایی دیت.

٣-میلودرامی/ئەو شانوییانەیە کە رووداوەکانی تیکەلە لە خوش و ناخوش.

پەیکەرەی شانویی بوئەوەی شانویی یەکی تەواو بیت دەبیت ئەمانەی تیدا بیت( پیشەکی-ناوەروك –کوتایی )

*بنچینەکانی شانویی/

( بیروکە-چیروك-کەسایەتی یەکان-ململانیی نیوان کەسیتی یەکان-حیوار-شیوازی نمایشکردنەکەی )

لەهەر کاریکی نواندندا کەسیتی ئەکتەرەکان بە چەند شیوەیەك دەردەکەون و رول دەگیرن وەك:

١-کەسی یەکەم (شخصية محورية) پالەوانەکان )ئەو ئەکتەرانەن کە رولی سەرەکی دەبینن.

٢-کەسی ناوەندی( شخسیة ثانوية )ئەو ئەکتەرانەن کەرولی کەمتر دەگێرن لە چاو پالەوانی نیو نواندنەکە.

٣-کەسی کومپارسی( شخسیة کوبارسية )ئەمانە ئەو ئەکتەرانەن بە کومەل دەردەکەون لەنواندنەکەدا کە هەندی جار دەم چاویشیان زور زووم ناکریت بەکەمی رولیان هەیە.



دیمەنیك لە جولەی ئەکتەران لەسەرشانو

*شانو/بریتەیە لەو شوینەی کە شانوگەری لەسەر نمایش دەکریت بەدریژایی میژوو تاکو ئەمرو شیوە ی شانو چەندین شیوازی جوارو جوری بەخووە بینیوە





*جورەکانی شانو/ شانوچەندین جورە لەوانە :-

( شانویی لاکیشەیی-بازنەیی- نمچە بازنەیی- پەردەدار –ئینارەو بلاجکیتوردار- ڤیستڤالی.......هتد )

## بەشی دووەم

### (دراماو زنجیرە دراما-فیلم)

* دراما/بریتی یە لە نمایش کردنی چیروکیک لەریگەی کومەلیک ئەکتەرەوە بینینی لەشاشەیەکی تایبەتەوەکەلەکوتایی دراماکەدا ئە نجامی کوتایی چیروکەکە دەزانریت.

*زنجیردراما/بریتی یە لە نمایش کردنی رووداویک لەلایەن چەند ئەکتەریکەوە بە چەند زنجیرەیەکەوە کەلەکوتا ئەلقەی زنجیرکەدا ئە نجامەکەی دەزانریت.

*فیلم/بریتی یە لە نیشاندانی رووداویک لەلایەن چەندین ئەکتەرەوە بەشیوەی (کورتەفیلم_فیلمی دریژ-فیلمی بەلگەنامەیی( دیکومینتاری )-فیلمی فیرکاری-فیلمی زانستی-فیلمی ترسناک-فیلمی میژوویی-فیلم کارتون-فیلمی ئەکشن.....هتد)

*فیلم کارتون/بریتی یە لەو جورە فیلمانەی کە مروڤ تیاید بەشدارنیە بەلکو تەنها وینەی جولاوو سری دی یە.

*فیلمی دیکومینتاری /هەموو ئەو فیلمانە دەگریتەوە بەلگە نامەین واتە راستی رووداون.

*فیلمی ئەکشن /بریتی یە لەوفیلمانەی کە جولەی زور خیرا لە دیمەنەکانیدا دیارە بەتایبەتی لە فیلمەکانی (ڤاندام-جاکیشان....هتد)







وینەی دیمەنی فیلمیک

وینەی دیمەنی فیلمیک




فیلمی ئەکشن      فیلم کارتون      فیلمی ترسناک      ئەفلام کارتون      فیلمی میژوویی

## کەرەستەکانی نواندن

*دەق/بریتی یە لەبەرهەمیکی نوسراوکە دەرهینەرو سیناریوی لیدروست دەکات و دەیداتە ئەکتەر بونمایش.

*دەرهینەر/ئەوکەسەیە هەلدەستیت بەدەرهینانی بەرهەمەکە.

*ئەکتەر/ئەوکەسەیە رول دەبینی لەکاری نوانەکەدابەشیوەی ( سەرەکی-لاوەکی-کومبارس )

*سینوگرافیا/دروستکردنی دیکورو باگراوندی دیکوری نوانەکەیە ئەمیش چەندین جوری هەیە .

*ماکیاج وجل و بەرگ/گورینی رووی ئەکتەرو شیوەی جل و بەرگیتی .

*ئیکسسوار/هەموئەو ووردەشتانەدەگریتەوەلەنواندنەکەدا بەشدارن وە( تەزبیح-خە نجەر موتومورو-بازن-ملوانکە....هتد )

*فلاش باک/بریتی یە لە دووبارە لیدانەوەی خەیالیکی رابردوو بەرەنگ و تەکنیکیکی تر لەنواندنەکەدا.

*رووناکی( ئینارە-بلاجیکتور/بەمەبەستی رووناکرنەوەی سەرتەختەی شانو بەکاردیت.

*موسیقاودەنگ/بریتی یە لەبەکارهینانی موسیقای تایبەت بەنوانەکە.

*تەکنیککاران/هەموو ئەو کەسانەن کە لە پشت شانو کاربو نواندنەکە دەکەن .

*شاشە/شاشەیەکی تایبەت بەنیشاندانی نواندنەکە.

*مونتاژ-مکساژ/دووکاری مونتاژن لە بو جیاکردنەوەو پاکردنەوەوتیکەلکردنی دەنگەو رەنگ بەکاردیت.

*دوبلاژ/بریتی یە لە گورینی زمانی بو زمانیکی تر لەریگەی دانانی دەنگیگی تر بو بەرهەمە نواننەکە.

## بەشی سێ یەم



## هونەری حەوتەم-سینەما

*هونەری حەوتەم( سینەما )/ئەم هونەرە یەکیکە لە لقەکانی هونەرە بینراوو بیستراوەکان کە بنچینەو سەرەتاکەی دەگەریتەوە بو هونەرمەندی



شیوەکار ( لیوناردو داڤینشی )لە هیلکاریە کانیدا.

بەلام سەرەتایەکی راستی بو دروستکردن و دوزینەوەی سینەما دەگەریتەوە بو سالی ١٨٩٥زئەویش لە ئە نجامی کوکردنەوەی ( فانوسی سیحری-یاری بینینی چاو-وینەو وینەگرتن.بەجوریك سالی ١٨٩٥ یەکەم ئامیر بو نیشاندانی وینە لە لایەن ( ئوگست-لویس لومیر )کەدووبرابوون لەوولاتی فەرەنسا داهینراو دوزرایەوە.

رەخنەگرو میژوونوسی سینەمایی ئەمریکی( فیلیپ کونجیلتون )ئەو قوناغانەی کە دروست بوون و گەشەکردنی هونەری سینەمای پیدا تیپەریوە دابەشی کردوون بو:-

١-سەدەی بنچینەوسەرەتا/لەم قوناغەی سینەماداکە لەسالی( ١٨٩٥-١٩١٠ )

پیشەسازی فیامسازی دەرکەوت .کامیراو تەکنیك و ئەکتەری هەندی پیداویستی سادە دەرکەوت بەلام فیلمەکان بیدەنگ بوون بەجوری یەکەم درامای رومان ماوەکەی پینج دەقە بوو لەم قوناغەدا نیشاندرا.

٢-سەدەی فیلمە بیدەنگەکان( ١٩١١-١٩٢٦ )

فیلمەکانی ئەم قوناغە پیشکەوتووتر بوون لە قوناغی پیشوو وەك تەجروبە

٣-سەدەی پیش جەنگی جیهانی دووەم( ١٩٢٧-١٩٤٠ )

ئەم سەدەیە بە سەدەی دەنگ و قسەو ووشە ناوبانگی هەبوو.لەم قوناغەدا یەکەم فیلم کە دەرهینرا فیلمی ( مغنی الجاز)ە سالی ١٩٢٧وە لە سیەکاندا زیاتر رەنگ و دەنگ پیشکەوت.سینەماکارانی ئەم قوناغە( کلارك جابل-فرانك کابرا-جون فورد -ئولیڤرهاردی )

٤-سەدەی ئالتونی فیلم( ١٩٤١-١٩٥٤ )

جەنگی جیهانی دووەم هەموو گورانکاریەکی لەفیلم هینایە ئاراوە بونمونە فیلمی کومیدیا بەشیوەیەکی زور دەرکەوت –وەفیلمە پرلەموسیقاییەکان نیشاندران-هەمەرەنگە فیلم هاتە بوون وەك فیلمی ترسناك-فیلمی دارستان فیلمی سەربازی و سیخوری بەلام فیلمی خەیالی زانستی سالی ١٩٥٠ دەرکەوت.سینەماکارانی ئەم چەرخە( کاری جرانت-همفر بومجارت )

٥-سەدەی کاتی فیلم( ١٩٥٥-١٩٦٦ )

ئەم قوناغەش قوناغی راگوزەری سینەمایە چونکە زور بەخیرایی ئامیری خیراو مونتاچکەرو هەروەها بو بەدیلی سینەما دروستکرا-لەگەل فیلمی هەمەرەنگ .سینەماکارانی ئەم چەرخە( الفریدهتشکەك-مارلین مورو-ئیلیزابیس تایلور )

٦-سەدەی زیوی فیلم( ١٩٦٧-١٩٧٩ )

٧-سەدەی فیلمی نوی ( ١٩٨٠-١٩٩٥ )

ووشەی هونەری حەوتەم ( سینەما )بویەکە مجار رەخنەگری فەرەنسی( ریتشیوتوکانودو )بەکاری هینا .




فیلمیکی سینەمایی



فیلمیکی سینەمایی

*راهینانە پراکتیکیەکانی( شانو-نواندن-سینەما )

*راهینانی( ١ )( راهینانی دەنگوشیوەی روخسار )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| راهینانی شانویی | بینراووبیستراو | جولەی لەش-دەنگ-شیوەی دەم وچاو | تەمرین مەسەحی-دەنگ-حالەتەدەرونیەکانلەدەم و چاودا | سەرەتای شانویی بە پراکتیکی |

*راهینانی( ٢ )( راهینانی جولەی لەش )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| راهینانی شانویی | بینراووبیستراو | جولەی لەش-دەنگ-شیوەی دەم وچاو | تەمرین مەسەحی-دەنگ-جولەی لەش لەسەر شانودا | سەرەتای شانویی بە پراکتیکی |

*راهینانی( ٣ )( دروستکردنی شانویی کورت )

| بابەت | هونەر | کەرەستە | تەکنیك | بەرهەم |
|---|---|---|---|---|
| راهینانی شانویی | بینراووبیستراو | جولەی لەش-دەنگ-شیوەی دەم وچاو | پیکهینان و نمایش کردنی کورتە شانویی | چەند کورتەشانویی یەك |

## بەندی سێ یەم



(هونەری موسیقا-Music art)

* موسیقا( موزیك )/ بریتی یە لە یەکیك لە هونەرە بیستراوەکان کە پیشت دەبەستیت بە( ریتم- ئاواز )لە ریگەی ئامیرە موسیقی یەکانەوە .ئەم هونەرە لەگەل مروڤدا گەورە بووە و دوزراوەتەوە لە سروشتدا .ووشەی موسیقا ووشەیەکی یونانیە .هونەری موسیقا بە هونەریکی روحی دادەنریت کە خواوەند بو مروڤایەتی ناردبیت.هونەری موسییقا لای زوربەی گەلان هەیە.سەرەتایەکی جوان و پرلەداهینانیشی لای گەلی کورد هەیە

بەجوری هونەرمەند( زریاب ) کە خاوەن داهینانی گەورەیە لە ئامیرەکانی موسیقا بەگشتی و ئامیری ( عود ) بەتایبەتی بکوردە بەجوری بەئەفسانەی موسیقای روژهەلات ناودەبریت.

هونەری موسیقا دەکریتە دوو جور/١-موسیقای کلاسیك ٢-موسیقای نوی

هەرچی موسیقای کلاسیکە بریتی یە لە موسیقاکانی ( بتهوڤن-موزارت-باخ-هایدن.....هتد )



وینەی موسیقار بتهوڤن بتهوڤن موسیقار باخ بتهوڤن

*موسیقای نوی/ ئەو موسیقایە کە جورەها ستایل و شیوازی لە خوگرتووە لەوانە( -راپ- پوپ-هیپ هوپ-روك-جاز)لە موسیقای روژئاوایی و لە روژهەلاتیش نمونەی موسیقای( ئەرابیسك-سونەتی )کاری تیدا دەکریت .




*پەیژەی موسیقا/بریتی یە لە پینج هیلی پیکەوەیی کە دەنگەکانی موسیقای لە سەر دابەش دەکریت کە حەوت دەنگن( دو.ری.می .فا.سوول.لا.سی ) بە هەشت دەنگی موسیقاش لە دەنگی دوبو دوی بەرز پیی دەوتریت ( ئوکتافیك )لەدەنگ.



*کلیلی موسیقا/بریتی یە لە کومەلە کلیلیك کە هەر یەکیان تایەتە بە هەندی لە ئامیرە موسیقایی یەکان لەنونەی (کلیلی دو-سول- فا)

*کاتەکانی موسیقا/بریتی یە لەکاتی خایەنراوی هەردەنگیکی موسیقا ئەوانیش :-

١-روند/چوارچە پلەیە. ٢-بلانش/دووچە پلەیە . ٣-نواریەك چە پلەیە. ٤-کروش نیو چە پلەیە .

٥-دەبل کروش١/٤چە پلەیەکە. ٦-تربل کروش١/٨چە پلەیەکە. ٧-کوارتربل کروش١/١٦چە پلەیەکە.



کاتەکانی موسیقا

*مەوداکانی دەنگی مروڤ/دەنگی مروڤ لە رووی ناسکی و گرە دەکرینە ئەم بەشانەی خوارەوە :-




*ریتم/بریتی یە لە و ترپە یەك لەدوای یەکانەی کە لە گەل ئاوازەکەدا ریك دەخریت.چەندین جوری هەیە وەك (ریتمی چوارلەسەرچوار-ریتمیدوولەسەر چوار-سی لەسەر چوار-شەش لەسەرهەشت)

*گورانی/گورانی ئەو ئاوازەیە کەلە گەروی مروڤیکەوە دیتە دەری بەچەندین جورو شیوازی جیاجیا وەك(گورانی نیشتمانی –ئاینی –خوشەویستی –مندالانە-ئیش وکار-سروود-مارش-کورال )

*مەقام/بریتی لە خاوترین بەشی ئاواز کە بەبی ریتم دەوتریت چەندین جوری هەیە لەوانە( حیجاز-بەیات –نەوا-سەبا-راست –سیگا-کورد-دەشت....هتد )

*گورانی بیژ/ئەو کەسەیە هەلدەستیت بە چرین و ووتنی گورانیەك یان مەقامیك یان سروودیك یان هەرجورە ئاوازیك بەگشتی گورانی بیژانیبیژان دەکرینە ئەم کومەلانەی خوارەوە :-

١-گورانیبیژانی روژهەلاتی:-

| گورانیبیژەمللی و سونەتیەکان | گورانیبیژانی ( ئەرابیسك-جاز ) |
| --- | --- |
| بریتی یی لەو گورانیبیژانەی کە لەگەل ئامیری مللی و سونەتی گورانی دەلین وەك١-گوانیبیژەکوردەکان( حەسەن زیرەك-عەلی مەردان-مەزهەری خالقی-کەریم کابان-....هتد٢-عەرەبی و فارسیو ( ئوم کەلسوم-حومەیرا-مەهەستی-شەجەریان-) | بریتی یە لە و گورانیبیژانەی کە گورانیەکانیان لەگەل ریتم و ئامیری جازوئەلیکترونیدایە وەك( ئەیوب عەلی-زەکەریا عەبدولا-....هتد لە عەرەبی و فارسی نانسی عەجرەم-موعین ئەسفەهانی-شیرین – هەیفا وەهبی.......هتد |

٢-گورانیبیژە روژئاوایی یەکان/

گوران بیژانی روژئاوایی( پاشای پوپ ( مایکل جاکسون-هیوستین-سیلینا-لیدیگاگا-شاکیرا.......هتد

*تیپی موسیقا/بریتی یە لە کومەلیك موزیك سیان کە کاریان ژەنینی ئاوازە بو گورانبیژیك ئەمانیش چەند شیوەیەکی هەیە

( تیپی موسیقای دوکەسی-سی کەسی-چوارکەسی- پینج کەسی –شەش کەسی –تیپی موسیقای سەربازی-تیپی موسیقای سەما )



*ئورکیسترا/بریتی یە لە تیپیکی گەورەی موسیقا کە نزیکەی سەد ژەنیاری لە خو گرتووە .بەسی جوریش هەیە لەوانە:-

١-ئورکیسترای بچووك/ئەمە نزیکەی ( ٣٠ ) ژەنیاری لە خوگرتووە.

٢-ئورکیسترای ناوەندی/نزیکەی ٤٠-٦٠ ژەنیاری تیدایە.

٣-ئورکیسترای گەورە /نزیکەی ٨٠-١٢٠ژەنیاری لە خوگرتووە.

*سولو/بریتی لە تاك ژەنین هەرئامیریك واتە ئامیریك بەتەنها لە تیپیکی موسیقادا دەژەنی بە شیوەکی زالترو بەەرزتر لەوان دەبیتە سولیست.

*ئامیرە موسیقایی یەکان/ئامیرە موسیقاییەکان بە پیی جورو سروشتی دەنگیان دەکرینە ئەم کومەلانەی لای خوارەوە .

١-ئامیرە ژیدارەکان/هەموو ئەو ئامیرانە دەگریتەوە کە لەریی لەرینەوەی ژیکانیانەوە موسیقاکە دروست دەبیت وەك ئامیرەەکانی ( کەمان-عود – سەنتوور-تار-سی تار- )

٢- ئامیر هەواییەکان/هەموو ئەو ئامییرانە دەگریتەوە کە لەریگەی فوکردن بەئامیرەکەدا موسیقا دروست دەبیت وەك ئامیرەکانی ( شمشال – فلووت-نەی –کلارنیت )

٣-ئامیرە پیستی یەکان /هەموو ئەو ئامیرانە دەگریتەوە کە لەریی پیاکیشان و لیدانی ئامیرەکەوە دەنگەکە دروست دەبیت وەك ئامیرەکانی ( دەف-تە پل-دەهول-دەف سنجان )

٣-ئامیرە پیتدارەکان( ئیقاعیەکان )/هەموو ئەو ئامیرانە دەگریتەوە کە لەریی پە نجە دانان لەسەر پیتەکانی موسیقاکە دروست دەبیت وەك ئامیرەکانی ( پیانو-کیبورت-ئوکوردیون-میلودیکا- )



کومەلیك لەئامیرە کانی موسیقا — ئامیری پیانو




ئامیری ئوکوردیون — ئامیری کیبورد( سایزەر ) — ئامیری کەمان( کەمانچە )



ئامیرە ( تەپل )    شمشال    گیتار بیز    ئامیری عود






تیپی جاز    تیپی موسیقای جاز

٢-هەندی لە نمونەی پەیکەر

پەروەردەی هونەری ( بو پولی دەیەم و یازدەهەمی زانستی و ویژەیی )

خویندنی سالی ( ٢٠١٣-٢٠١٤ )

دانانی /م.کاوەنوری –دەچوی کولیژی هونەر زانکوی سلیمانی –بەشی پەیکەرسازی